# وەلامێكی كورت بۆ د. عبداللطيف لە سێ خاڵی پوخت

لەدوای ئەوەی چەند جارێك داوای گفتوگۆ و(مناظرة)مان لە د. عبد اللطيف كردوە بەشێوازێك كە بە (فضل) ی خوا پاپەند بوینە بە رێبازی (أهل السنة والجماعة) ورێرەوی پێشینانی چاك، بەڵام بە داخەوە هە موو جارەكان وەڵامی نەگونجاوی داوەتەوە، بە بیانوی جوراو جۆر ئامادە نەبووە و ڕای كردوە، تەنها توانیویەتی تۆمەت ببەخشێتەوەو فیز(تكبر) بكات، ئەو جارەش وەك جارانیتركە داوامان لێ كردوە وەڵامێكی چەند خولەكی داوەتەوەو ئامادە نەبوو، جابۆ ئەوەی ئەو جارە بەسەری دا نەڕوات و تەواو حەق و نا حەق دیار بێ بۆ مووسلمانان، ئەو سێ خاڵانە پێشكەش بە مووسلمانان بەگشتی وقوتابی و فەقێە بە رێزەكانی د. عبداللطیف بە تایبەتی دەكەم داوایان لێدەكەم بە لەبەر چاوگرتنی قیامەتیان و گەیشتن بە دیداری خوا، كە لەوێ كەس بە كە ڵكی كەس نایەت و هەموو ڕاستی و ناڕاستیەكان بە دیار دەكەوێت، گوێ بگرن و بڕیاربدەن راستیەكان چۆنەو لە كوێیە، داوا لە قوتابی وخۆشەویستانی خۆشم دەكەم:كە بە دوای ڕاستی بكەون هیچ حیسابێك بۆ من نەكەن، منیش بەندەیەكم قابیلم بۆ هەڵەكردن، دەمارگیری بۆ هیچ كەسێك و لایەك درووست نیە، تەنها بۆ قورئان و سووننە نەبێت، بە واتای تەسلیم بوون وپابەند بوونی تەواو پێیانەوە، من خۆمم پێ رزگار نابێ لە خزمەت خوا مە گەر بەرەحم و(فضل)ی خۆی لە گەڵم بكات ، چچای كەسێكیتر، جا ئەگەر بۆتان روون بۆوە قسەكانم تێك دەكاتەوە لە گەڵ قورئان و سوننە بە تێگەیشتنی سەلەفی ئومە، ئەوە بە قسەم بكەن لێم وەرگرن و دوعای خێرم بۆ بكەن، ئەگەر واش نەبوو ڕاستم بكەنەوەو لێم وەرمەگرن. بەئومێدی ئەوەی جەنابی دكتۆریش واز بێنێ لە فیزو حیساب نەكردن بۆ خەڵك، ئەگەر زانای؟ با سوود ببینین لە زانستیەكەت. ئەگەر لە سەر حەقی؟ تێمان بگەینە با خێرت پێ بگات. خۆ ئەگەر بەقسەشت نەكەین ئەوە بۆتۆ و رێبازەكەت بردنەوەیەو حوجەشت كردوە لە سەرمان.

## سێ خاڵە پوختەکە:

**١-گفتوگۆ (مناظرة) شەرعیەو جاریش وایە پێویست دەبێت:**

**بەڵگە لەسەر گفتوگۆ لە قورئان و فەرموودە زۆرە من لەبەر کورت کردنەوە تەنها دوو فەرموودە دێنمەوە کە بەڵگەن لە سەر وەڵام دانەوەو کات تەرخان کردن بۆ کەسێك کە بیەوێت پرسیار و گفتگۆ بکات بە تایبەتی لە بابەتە شەرعیەکان لە نێویشیان بابەتی بیرو بڕوا:**

**١- قال كُرَيْبٌ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂: صلَّى النَّبِيُّ ﷺ بعد العصر رَكعتَين وقال (شغلني نَاسٌ من عَبد الْقَيْسِ عَنْ الرَّكْعَتَيْنِ بعد الظُّهر).**

**صحيح البخاري : بَاب مَا يُصَلَّى بَعْدَ الْعَصْرِ مِنْ الْفَوَائِتِ وَنَحْوِهَا.**

**واتە: کورەیب لە ئوم سەلەمەیەوە خوالێیان رازی بێت گوتی: پێغەمبەر ﷺ دوو رکاتی لە دوای عەسر کرد فەرمووی:(خەڵکێك لە عەبدوولقەیس سەرقاڵیان کردم لە دوو رکاتەکەی دوای نیوەرۆ). کە لە درێژەی ریوایەتەکە هاتووە خەڵکەکە پرسیارو گفتوو گۆیان هەبوە دەربارەی ئیسلام پێغەمبەر ﷺ نوێژی راتبەی کە بە لای هەندێك لە زانایان لە سەری واجب بووە دوای خستوەو لە کاتی خۆی نەیکردوە، لەبەر بایەخدانی بە بیرو بڕواو ئاین و رەتنەکردنەوەیان .**

**جا پرسیار دەکەین مادام جەنابی دکتۆر هێندە لە خۆیو ریبازو مەنهەجەکەی رازیەو بێ باکە بۆچی کاتێك تە رخان ناکات بۆ گفتوگۆ و پابەند نابێت بە بەڵگەو فەرموودانە ؟؟**

**ئەوەش ریواتەکەی (صحيح مسلم) یە:**

**(فقالت: ام سلمة سمعت رسول الله ﷺ ينهى عنهما ثم رأيته يصليهما اما حين صلاهما فانه صلى العصر ثم دخل وعندي نسوة من بني حرام من الانصار فصلاهما فارسلت إليه الجارية فقلت قومي بجنبه فقولي له تقول ام سلمة يارسول الله اني اسمعك تنهى عن هاتين الركعتين واراك تصليهما فان اشار بيده**

**فاستأخرى عنه قال ففعلت الجارية فاشار بيده فاستأخرت عنه، فلما انصرف قال يا بنت ابى امية سألت عن الركعتين بعد العصر انه اتانى ناس من عبد القيس بالاسلام من قومهم فشغلوني عن الركعتين اللتين بعد الظهر فهما هاتان.**

**٢- عن أبي رفاعة العدوي قال: انتهيت إلى النبي ﷺ وهو يخطب، فقلت: يا رسول الله! رجل غريب جاء يسأل عن دينه، لا يدري ما دينه؟ فأقبل إلي وترك خطبته. فأتي بكرسي خلت قوائمه حديداً، - قال حميد: أراه خشباً أسود حسبه حديداً- فقعد عليه، فجعل يعلمني مما علمه الله، ثم أتم خطبته" آخرها[1]. صحيح الأدب المفرد: ١١٦٤/٨٩١.**

**واته: له باوكی رافیعه‌ی عه‌دەوی گوتی: گه‌یشتمه لای پێغه‌مبه‌ری ﷺ خوتبه‌ی ده‌دا، پێم گوت: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پیاوێكی غه‌ریبه هاتووه و پرسیاری ئاینه‌كه‌ت لێده‌كات نازانی ئاینه‌كه‌ی چیه؟ پیغه‌مبه‌ریش ﷺ رووی تێكردم ووازی له ووتاره‌كه‌ی هێنا، كورسیه‌كیان بۆ هێنا پێچكه‌كانی له ئاسن بوو. حومه‌ید ده‌ڵێ: وابزانم داری ره‌ش بوو ئه‌و به ئاسن تێگه‌یشتووه، باوكی رافع گوتی: له‌سه‌ر كورسیه‌كه دانیشت، فێری كردم به‌وه‌ی كه خوا فێری كردبوو، له پاشان ووتاره‌كه‌ی ته‌واو كرد.**

**ده‌بزانن پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺچۆن ووتاری بڕیو مینبه‌ری جیٛ هێشت بۆ وه‌ڵامدانه‌وه‌ی داواو پرسیاری دین و عه‌قیده.**

**پرسار ده‌كه‌ین له جه‌نابی دكتۆری ئه‌گه‌ر ئێمه‌ت پیٛ گومراو لارێیه؟ یان نه‌زان و بیٛ عیلمه؟ پێویسته له‌سه‌رت ئیقتیدا به پێغه‌مبه‌رﷺ بكه‌یت واز بێنی له ئیش و كارو وانه‌و ووتار ....هتدو حوجه‌مان له**

---

(١)الأصل: "ثم أتم خطبته آخرهأ" والمثبت في "صحيح مسلم" (١٥/٣) و"المسند" (٨٠/٥). صحيح الأدب المفرد للإمام البخاري بقلم أبي عبد الرحمن محمد ناصر الدين الألباني رحمه الله تعالى نشر دار الصدّيق توزيع مؤسسة الريان ط١: ١٤٢١هـ

**٢-ڕاکردن لە گفتوگۆ دۆران و داش دامانە:**

**کاتێك عبدالله کوڕی عباس ﷺ چوە لای خەوارجەکان کە پێان دەگوترا حەرورِیەکان بۆ گفتوگۆ: قال بعضهم: لا تحاوروا ابن عباس، لا تخاصموه، فإن الله تعالى يقول عن قريش: ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ﴾الزخرف:٥٨، فلما خافوا من الهزيمة قالوا: اتركوا هذا، هذا جدل إنسان خَصِم! وقال بعضهم: بل نكلمه، ولننظر ماذا يقول؟[١]**

**واتە: هەندێکیان گوتیان گفتوگۆ لەگەڵ کوڕی عباس ﷺ مەکەن رکابەری مەکەن چونکە خوای بەرز دەربارەی قورەیش دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ﴾، واتە:ئەوان خەڵکێکن هەر دەمبازی دەکەن. لەدوای ئەوەی ترسان لە شکست خواردن و دۆڕان گوتیان: واز لەوە( واتە ابن عباس) بێنن ئەو گفتوگۆ یە جەدەلێکە لە گەڵ ئنسانێکی دەمبازە؟ هەندێکیشیان گوتیان: بەڵکو قسەی لە گەڵ دەکەین، بزانین چ دەڵێت؟**

**لە ئەنجامدا بە هەزاران خەواریج هیدایەتیان بوو هاتنەوە سەر رێگای ڕاست.**

**جا نازانم جەنابی دکتۆریش لەوە دەترسی بە دەردی خواریجەکان بچیٚ ئەگەر وا نیە بۆ ئامادە نیە گفتوگۆ بکات؟**

**شیخ عبدالعزیز بن بازی** رەحمەتی خوای لێبێت **دەڵیٚ: شیعە کان لە سەر دەمی شیخ محمد بن ابراهیم آل الشیخ** رەحمەتی خوای لێبێت **نامەیەکیان بۆ نارد کە گفتو**

---

(١) عبدالرزاق في المصنف:(١٠/١٥٠) رقم: ١٨٦٧٨. والنسائي في السنن الكبرى كتاب الخصائص، باب ذكرمناظرة عبدالله بن عباس الحرورية...:(٧/٤٧٩) رقم: ٨٥٢٢. وغيرهما. والحديث أخرجه الحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم وقال الذهبي في التلخيص:( على شرط مسلم). وە ئەو گیرانەوەیەش زانکۆی (أم القرى) توێژینەوەی لە سەر کردوە ئەگەر کەسێك بیەوێت سودی لێوەر بگریٚ.

گۆیان لەگەڵ بکات ئەویش ویستی پشت گویان بخاو وەڵامیان نەداتەوە، بەڵام شیخ عبدالرزاق عفیفی ڕەحمەتی خوای لێبێت گوتی: ئەو کارە مەکە شکستخواردنە بۆ ئێمە بەڵام نامەیان بۆ بنووسەو بابەت وتەوەرو سەرچاوەکانی گفتوگۆ یەکە دیاری بکە ئەوە بردنەوەیە جا ئەویش بە پێشنیارەکەی ڕازی بوو، بە خۆیان ناین و نایکەن و بردنەوەیە بۆ ئێمە.

جا منیش لەبەر پابەند بوون بە ئاداب و بنەماکانی گفتوگۆ بە ئیقتدا کردنمان بە زانایان: تەوەرو بابەتمان بۆ گفتوگۆکە دیاری کردبوو، نەوەك بۆ ئەوەی جەنابی دکتۆر دوور لە هەموو بنەما شەرعی و ئادابەکانی (مناظرة) بکەوێتە تۆمەتبەخشینەوەو قسەی بێ بە ڵگە؟؟

جا ئەگەر بەرێزیان نامانناسن هەروەکو لە شێوازی وەڵامە ڤیدیویەکەی وا دەری دەخات، خۆ دڵی ئێمەی لەت نەکردووە کە ئێمە چ مە بەستێکمان هەیە ئەی ئەو نیە کە هەموو جاران لە مەسەلە کوفری ئیمانیەکانیش باسی نیەت و ناو دڵ دەکات دڵی نایەت بە کەس بڵێ کافر تەنانەت گومانی باش بەکافرو بێ بڕوایانیش دەبات.

خۆ ئەگەر دەمانناسێ وا دەرنابڕی ئەوە چەواشەکارییە کە دەیکات. وە ئەگەر بیرو باوەڕیشمان دەزانێ بۆی ڕوونبویتەوە کە لەسەر مینبەر بووین چۆن بە (فضل الله) بەرگریمان لە خواو پێغەمبەرﷺ وڕێبازی ئیسلام دەکردو نموونەی مریوان هەلبجەیی بێ غیرەت بە نهێنی ودزیەوە بە پاڵپشتی ئەوانەی بەرێزی بە موسلمانێکی تەنها گوناهکاریان دادەنێت ڕەوانەی وەلاتانی کافران کرا، بەڵام ئەوە لە سەردەمی بەنگەوازی و هەبوونی کەناڵو زۆربوونی شوێن کەوتوانی بەرێزیانە دەگەڕێندرێتەوە کوردستان و لە شار بۆ ئەو شار کۆڕو کۆبونەوەی بۆ ساز دەکرێت؟؟

جا بڕیار بدەن لەبەر خاتری خوا کامە هەڵویست ڕاست و دروستڕەو هی پیاوانە؟؟

٣-داوای مباهلە لە بەرێزیان دەکەم :

(مباهلة) کە لە رێرەوی پێشینانی چاکەو چەندەها جار کردویانە جائێمەش لە و روانگەیەوە داوا لە جەنابی دکتۆر دەکەین با بێت چ لە مزگەوتەکەی ئەو یان لە سەرکەناڵکەیان (مباهلة) بکەین لە سەر ئەوەی :

ئایە ئەو تەوەرانەی کە دیاریمان کردبوو ئیمان وکوفر و (ولاء و براء) و (حکم بغیر ما أنزل الله) ئەو (منهج) ەی بە ریزیان لەسەرن تەواوەو (موافق)ی قورئان و سوننە و (فهم)ی سەلەفی ئوممە یە یا ن هی ئێمە؟

لە سەر ئەوەش کە (منهج) و رێبازی من (تکفیر) یەو پێچەوانەی (أهل السنه والجماعه)یە.

وە لەسەر ئەوەش کە سەرکردەو بەرپرسە عەلمانیەکانی کوردستان موسلمانن و دەبێ گوێرایەلیان بکرێت.

## کۆتایی:

مەبەستمان شکانەوەی هیچ کەسێك نیەو تەنها دەمانەوێت بەرگری لە رێبازی ڕاستەقینەی سەلە ف بکەین و خەڵکی لە سەر رێگای تەواوی خوایی بژی و بمری، جا ئومێد دەکەم جەنابی دکتۆرو شوێن کەوتوانی گوێ بگرن و بە پیل بانگەوازی و داواکەمانەوە بێن خوا هیدایەتی من و ئەوانیش بدات.

اسماعیل سوسەیی

هەولیر گەرەکی زانایان